سێ شەمبێ، کو رۆژا چارێ یە ژ حەفتیێ. دگەل ئەلندێ، دیکلێ چارێ، ئەوێ ب "قیقیێ کەسکین" هاتبوو ناڤ کرن، دهات و بانگ ددا.
ئاسمان وەکی زومرودەکێ دچرسی و بەری رۆژ بهەلێت ئەسمانێ گوندی تژی رۆناهیەکا کەسك دبوو.

سێ شەممە، چوارەمین رۆژی حەفتە بوو. بەرەبەیان کەڵەشێری چوارەم کە بە قوقولی سەوزە بانگیان ئەکرد. ئەهات و دەستی بەخوێندن ئەکرد.
ئەوسا ئاسمان وەکو زومرود بریسك و هۆڕ ئەدەروشایەوە،
بەر لەوەی خۆر دەرکەوتایە هەوای گوند پڕ ئەبوو لە نورێکی سەوز.

چارشەمبێ، ئانکو رۆژا پێنجێ ژ حەفتیێ، دگەل بەربانگێ سبێ "قیقیێ سەدەڤ" دیار دبوو. ئەو دیکلێ پێنجێ یێ گوندی بوو و ب بانگێ خو گوند تێکدا شین دکر. دناڤ پەڕێن وی دا هەمی جۆرێن رەنگێ شین هەبوون، شینێ تاری شینێ ئەسمانی، نیلی و شینێ فەیرۆزی.

ب دیتنا پەرێن وی بیرا مرۆڤی ل ئاڤا دەریایێ دهات.

چوارشەممە یانی رۆژی پێنجەمی حەفتە، لەگەڵ بەرەبەیاندا قوقولی سەدەف پەیدا ئەبوو کە پێنجەمین کەڵەشێری گوند بوو، بە ئاوازەکانی تێکرای گوند شینی ئەنواند. لە پەرەکانیدا هەموو جۆرە شینییەك ئەبینرا: شینی تێر، شینی ئاسمانی، نیلی و پیرۆزەیی.

مرۆڤ کە پەڕەشینەکانی ئەوی ئەدی دەریا شینەکانی بیر ئەکەوتەوە.

دیکلێ شەشێ، رۆژا شەشێ یا حەفتیێ، ئانکو پێنجشەمبێ دهات و ب بانگێ خۆ هەمی ژ خەو هشیار دکرن. بەربانگێ پێنجشەمبیا هەمی دەما یێ نیلی بوو وەکی پەرێن قیقیێ رەنگ نیلی و ب رەنگێ نیلی هەمی جهـ نیلی دبوون و وێنێ نیلیێ ئەسمانی ژ بلنداهیێ دا دکەتە سەر بانێ مالێن گوندی و ئەسمانی ژی بەرێ خۆ ددا خۆ.

کەڵەشێری شەشەم، شەشەم رۆژی حەفتە واتە پێنج شەممە ئەهات و بەئاوازەکانی هەمووانی خەبەر ئەکردەوە، بەرەبەیانی پێنج شەممانە هەمیشە نیلی بوو، هەر وەکو پەڕە نیلیەکانی قوقولی نیلی کە رەنگی نیلی بوو، یانی ئاوییەکی تۆخ.
هەموو جێیەك نیلی ئەبوو. وێنەی نیلی ئاسمان لەو بەرزاییەوە ئەکەوتە ناو ماڵەکانی گوندەکەوە و ئاسمانیش سەیری خۆی ئەکرد.

ئەینیێ، رۆژا حەفتێ ژ حەفتیێ یە، رۆژا بهێنڤەدانێ بوو.
لێ دیكلێ حەفتی هەر كارێ خۆ دكر. دگەل بەربانگا سبێ دا ب سەر پەرژانەكی كەڤیت و بانگ دەت.
ژ پورکا سەری هەتا دویماهیا كوریێ یێ بنەفشی بوو.
دەما بانگێ وی ل كۆلانان دەنگ ڤەددا، ئەرد و ئەسمان بنەفشی دبوو.

هەینی، حەوتەمین رۆژی حەفتە هەموو بێ كاربوون.
بەڵام كەڵەشێری حەوتەم كاری ئەكرد. لەگەڵ بەرەبەیاندا ئەفڕییە سەر پەرژینێك و ئەیقوقاند، لە پۆپەنەكەیەوە تا پەڕەكانی كلكی وەنەوشەیی بوو.
هەموو پێیان ئەوت )) قوقولی وەنەوشە((. كە ئاوازەكانی بە كۆڵانەكاندا بڵاو ئەبوەوە، ئاسمان و زەوی وەنەوشەیی ئەبوو.

ئو هۆسا هەمی رۆژ و رۆژێن دی، هەمی حەفتی و حەفتیێن دی، ئەو حەفت دیکل ب دۆر دهاتن و بانگ ددان و ئەسمان و بایێ گوندی ژی هەردەم...

- شەمبیا یێ سۆر بوو.
- ئێك شەمبیا یێ پرتەقالی بوو.
- دوشەمبیا زەرێ کناری بوو.
- سێ شەمبیا کەسکێ زومرودی بوو.
- چارشەمبیا یێ شین بوو.
- پێنجشەمبیا یێ نیلی بوو.

و ئەینیا ژی دا بێژی کراسەکێ بنەفشیێ کریە بەر خۆ.

ئیتر رۆژگەل و حەفتەگەل کەڵەشێری گوند بە نۆرە ئەهاتن ئەیانقوقاند.

ئاسمان و هەوای گوندیش هەمیشە،

- شەممانە سوور بوو
- یەك شەممانە نارنجی
- دووشەممانە زەردی کەناری ئاسا
- سێ شەممانە سەوزی زومرودی
- چوارشەممانە شین
- پێنج شەممانە نیلی و

هەینیش ئەتوت دەستێ جلی وەنەوشەیی لە بەرئەکات.